بسم الله الرحمن الرحيم



پاشکۆی هاویری ژماره/٤

# حوکمی کۆچ کردن

# بۆ دەرەوەی وولات لە

# روانگەی ﴿شەرع﴾ ەوە

بسم الله الرحمن الرحيم

# حوكمی كۆچ كردن بۆ دەرەوەی وڵات لە ڕوانگەی (شەرع) وە

لە دوای ئەوەی سەرنجماندا، كەوا گەنجانی موسوڵمان خەریكی ئەوەن نیشتیمانی خۆیان جێدەهێڵن و بەرەو وڵاتانی دەرەوە كۆچ دەكەن، بەرۆیشتن و چوونە دەرەوەشیان لە وڵاتدا، سەرنجامیكی خراپ و ترسناكی دەبێ بە سەر موسوڵمانانەوە، بۆیە بڕیارماندا مانای كۆچ كردن (هجرة) لە رووی زمانی و شەرعی و دروستی و نادروستی‌یەوە روون بكەینەوە، بۆ ئەوەی گەنجانمان لێی سوودمەندبن و لەكاروباری دینەكەیان زیاتر شارەزابن و لایان روون بێ، بەیارمەتی خوای گەورە.

# پێناسەکردنی هیجرەت کردن لە رووی زمانی و شەرعییەوە

**١. لە رووی زمانییەوە:**

بەمانای (الترك) دێ لە سەر وەزنی (هجر)، واتە (ترك) بە مانای وازی هێنا، دەڵێن (هجر الرجل زوجته)، واتە پیاوەکە وازی لە خیزانەکەی خۆی هینا، هەروەها دەلین (هجر الرجل أخاه)، واتە: پیاوەکە وازی لە براکەی خۆی هێنا.

**٢. لەرووی شەرعییەوە:**

کۆچ کردنی موسوڵمان لە وڵات و نیشتیمانی خۆی لە پێناوی خوای گەورە لە ویست و لە کردەوەیدا، مەبەستی پێ وەدەست هینانی رەزامەندی خوای بالادەست بێ، ئەو کاتە کردەوەکەی وەردەگیری و پاداشتیشی لە سەر وەردەگیری، بەلگەش بۆ ئەوە فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ)، کە دەفەرموی ﴿ إنما الأعمال بالنيات وإنما لكل أمرىء ما نوى، فمن كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله ومن كانت هجرته لدنيا يصيبها أو أمرأة ينكحها فهجرته الى ما هاجر اليه/ رواه البخاري ومسلم عن عمر (رضي الله عنه) ﴾، واتە: کشت کار و کردەوەیەك بەنیەت نەبێ دانامەزرێ، هەر

کەسێك کار و کردەوەیەك ئەنجام بدات بە گوێرەی نیەتەکەی پاداشتی لە سەر وەردەگرێتەوە، جا هەریەکی کۆچ کردنی لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر لە نیەت و کردەوەیدا بە تەواوی بۆ خوای گەورە بێ و مەبەستی پێ وەدەست هێنانی رەزامەندی ئەو بێ، ئەوا کردەوەکەی وەردەگیرێ و پاداشتی لە سەر وەردەگرێ، بەڵام ئەگەر کۆچکردنەکەی تەنها بۆ وەدەست هێنانی سوودێکی دونیایی بێ، یاخود بۆ خوازبێنی کردنی ئافرەتێ بێ، ئەوا کردەوەکەی لێوەرناگیرێ و پاداشتی لەسەر وەرناگرێ ( واتە کۆچەکەی بۆ ئەو شتەیە کە مەبەستی بووە).

کەوابوو هەر کەسێ کۆچ بکات بۆ ئەوەی سوود و قازانجێکی چنگ کەوی و مەبەستی تەنها لەسەر ئەمە کورت هەلبێنێ، ئەوا هیچ ئەجرو پاداشتێکی بۆ نیە و نابێ.

## وڵاتی ئیسلام و وڵاتی جەنگ و وڵاتی ئاشتەوایی

بەر لەوەی بچینە ناو درێژەی باسی کۆچکردن، پێویستە ئەم وڵاتە بناسین کە موسولمان کۆچی بۆ دەکات، تاکو دروستی و نادروستی کۆچکردن لە یەکتری جیابکەینەوە و بۆمان روون ببێتەوە. فەقیهانی ئیسلام دابەشیان کردۆتە سەر سێ وڵات، کە ئەمانەن:

**ولاتی ئیسلام:** فەقیهان پێناسەی زۆریان بۆ کردووە، ئێمە لێرەدا چەند پێناسەیەکیان دەهێنینەوە، (عەلامەی سەرخەسی) بەم جۆرە پێناسەی دەکات: ( دار الأسلام أسم للموضع الذي يكون تحت يد المسلمين و علامة ذلك أن يأمن فيها المسلمون)، واتە: ولاتی ئیسلام ناوێکە دەبرێتە سەر ئەو شوێنەی لە ژێر دەستی موسوڵمانان دایە، نیشانەی ئەمەش ئەوەیە کەوا موسوڵمانان تیایدا ئارام بن. (الزيدية) ش بەم جۆرە پێناسەی دەکات: (هي التي فيها شعائر الإسلام بقوة المسلمين و منعتهم ولا يظهر فيها غيرها إلا بالذمة والأمان من المسلمين)، واتە: ئەو ولاتەیە، کەوا دروشمەکانی ئیسلامی تێدا ئەنجام دەدرێ، بەهۆی هێزو پارێزگاری موسوڵمانانەوە و کەسی تری تیادا نەبێ، مەگەر بە پەیمان و ئەمانی موسولمانان بێ). شیخ (عبدالوهاب) یش بەم جۆرە پێناسەی کردووە: (إنها الدار التي تجري عليها أحكام الإسلام ويأمن من فيها بأمان الإسلام سواء أكانوا مسلمين أو ذميين)، واتە: ئەو ولاتەیە، کەوا حوکمی ئیسلامی تێدا دەگەرێ و ئەوانەشی کە تیایدا لە

ژێر سایەی ئیسلامەوە ئارام بن، جا ئەگەر ئەوانە موسوڵمان بن، یاخود ناموسوڵمان.

ئەوەی ڕاستی بێ جیاوازی لە نێوان پێناسەکاندا نی یە، چونکە ئەو وڵاتەی کەوا دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان، حوکمی ئیسلامی تێدا دەگێردرێ، کەوابوو مەرجی بنچینەیی بۆ ئەوەی ئەم وڵاتە بە وڵاتی ئیسلام بژمێردرێ ئەوەیە، کە لە لایەن موسوڵمانانەوە حوکم بکرێ و لەژێر دەسەڵات و سەرکردایەتی ئەوان دابێ، ئەو کاتە حوکمی ئیسلامی تێدا دەردەکەوێت، هەروەها مەرج نی یە ئەم وڵاتە موسوڵمانی تیادابێ مادام لە ژێر هێز و دەسەڵاتی ئەواندابێ. دەربارەی ئەمە (رافعی) دەڵێ: (ليس من شرط دار الإسلام أن يكون فيها مسلمون بل يكفى كونها في يد الإمام و .......)، واتە: (مەرج نی یە وڵاتی ئیسلام، موسوڵمانانی تێدا بژی، بەڵکو ئەمە بەسە، کەوا لە ژێر دەستی موسوڵمانان بێت). کەوابوو وڵاتانی ئیسلام بە گشتی بەیەك وڵات دەژمێردرێت، ئەگەر بێت و حاکمەکانیشیان جیاوازبێ و ببێتە وڵاتی جیاجیا. لەبەر پراکتیك کردنی حوکمی ئیسلام تیایاندا، چونکە ئەم جیاوازیە نابێتە هۆیەك بۆ نەمانی حوکمی ئیسلامی لە سەرجەم ئەو وڵاتانەدا.

٢. **ولآتی جەنگ (دار الحرب):** ئەم ولاتەیە، کەوا لە ژێر دەسەڵاتی موسولمانانندا نی‌یە، دەربارەی ئەمە (الزیدیە) دەڵێ: (واعلم أن دار الحرب هي الدار التي شوكتها لأهل الكفر ولاذمة من المسلمين عليهم)، واتە: بزانە، کەوا ولاتی جەنگ بریتی‌یە لەو ولاتەی کە هێز و دەسەڵاتی کوفری تیدایە و پەناو پارێزی موسولمانانیان بەسەر دانی‌یە. ئاشکرایە، ئەم جۆرە ولاتە حوکمی ئیسلامی تیدا ناکرێ، لەبەر حوکم کردنی غەیری ئەوان، هەروەها هەندێ لە فەقیهانی هاوچەرخ بەم جۆرە پێناسەی دەکەن: (هي الدار التي لا تجري فيها أحكام الإسلام ولا يأمن من فيها بأمان المسلمين)، واتە: ئەو ولاتەیە، کەوا حوکمی ئیسلامی تیادا ناگیردرێ، ئەوانەشی کە تیایدا دەژین لە ژێر سایەی موسولماناندا لە ئارامی و ئاسایش دا نەبن. هەروەها ئەهلی ولاتی جەنگ، وادادەنرێن کەوا لە جەنگ دان بەرامبەر موسولمانان و سەر و مالیان پارێزراو نابێ لە لایەن ئەهلی ولاتی ئیسلامەوە، لەبەر ئەوە پارێزراوی سەر و مال لە شەریعەتی ئیسلامدا بە یەکێ لەم دوو شتە دەبێ، بە ئیمان هێنان، یا خود بە پەنادان لە لایەن موسولمانێکەوە، بەلام ئەهلی جەنگ هیچ یەکێ لەم دووانەی نی‌یە.

ولاتی (جەنگ) یش ئەو کاتە دەبێتە ولاتی ئیسلام ، ئەگەر حوکمی ئیسلامی تیدا رابگەیەنرێ، هەروەها ولاتی (ئیسلام) یش ئەو کاتە دەبێتە ولاتی جەنگ، ئەگەر حوکمی کوفری تیدا رابگەیەنرێ، ئەمە لەلای (أبی یوسف و محمد و الزیدیە) دا.

١. **ولاتی تیکەلاو (المرکبە)**: حوکمی ئەو دەولاتە ئیسلامیە، یا خود ئەو ناوچە ئیسلامیە دەبێ چی بێ، کە لەلایەن دەولەتیکی کوفرەوە دەستی بەسەرداگیرابێ، ئاخۆ بە ولاتی کوفر دەژمیردرێ، یاخود هەر بە ولاتی ئیسلامی دەمینیتەوە. سەبارەت بەم بابەتە لە شیخی ئیسلام (ئیبنو تەیمیە) یان پرسی: لەو کاتەی کەوا ولاتی (ماردین) لە لایەن کافرانەوە دەستی بەسەر داگیرلو ئەهلەکەشی موسولمان بوون، ئایا ئەمە بە ولاتی جەنگ دەژمیردری؟ یا خود بە ولاتی ئیسلامی؟ ئەویش لە دوای ئەوەی، دەربارەی هەلویستی موسولمانان بەرامبەر بە کافران دوا، گوتی: دەبارەی ئەوەی کە ئایا دەبیتە ولاتی (جەنگ)، یا خود دەبیتە ولاتی (سلم)، ئەوا تیکەلاوە لە هەردووکیان بەدووخالی دیاریکرلو: (أ) وەکو ئەم ولاتە (سلم)ە نی‌یە کەوا حوکمی ئیسلامی تیدا پیادە دەکرێ لەبەر ئەوەی سەربازەکانی موسولمان نینە. (ب) وەکو ولاتی

(جەنگ) یش نی‌یە کەوا خەلکەکەی کافرن، بەلکو بریتی‌یە لە بەشی سیێیەم، کەوا تیایدا موسولمان بە حەقی خۆی مامەلەی لەگەلدا دەکرێ و ئەوەشی کەوا لە شەریعەتی ئیسلام دەرچووە بە حەقی خۆی جەنگی لەگەلدا دەکرێ. (عزی کوری عبدالسلام) یش ناوی ئەم ولاتەی ناوە بە ولاتی ئیسلامی داگیرکرلو.

ﷺﷺﷺ

## هۆیەکانی کۆچ کردن

موسولمان دەبی ئەوە بزانێ، کەوا چەند هۆیەك هەیە بۆ کۆچ کردن، بە هۆیانەوە کۆچکردن بۆی جائز دەبێ، بەبێ بوونی یەکی لەم هۆیانە کۆچکردن بۆ کەس جائز نابی جا بە هەر شیوەیەك بێ. هۆیەکانیش ئەمانەن:

١. کۆچکردن بە هۆی جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورە.
٢. کۆچکردن بۆ زانست و زانست خوازی.
٣. راکردن لە ولاتی کوفر.
٤. هەلاتن بەدینەکەیەوە لە ترسی فیتنە(الفتنە).

٥. کەسی کەوا ئەمیری موسولمانان بینێرێ بۆ جێبەجێکردنی پێویستی موسولمانان، وەکو بۆ کاری سەفارەت و بازرگانی و .......هتد.

بەڵگەش لەسەر ئەمانە ئەو فەرموودەی پێغەمبەرە ( ﷺ )، کە دەفەرمووی: ﴿لا هجرة بعد الفتـح ولكـن جهـاد و نيـة وإذا أستنفرتم فـأنفروا/ رواه الجماعـة وأبـن ماجـة﴾، واتە: دوای فەتح بوونی مەکە کۆچکردن نی‌یە، بەڵام بۆ جیهادکردن و نیەتی چاك دەمینی، جا ئەگەر داوای دەرچونتان لی‌کرا بۆ جیهاد دەرچن.

لیرەدا کۆچکردن بەمانای جێهیشتنی نیشتمان هاتووە، دەربارەی گوتەی (ولكـن جهـاد ونيـة)ش، (طيبـی) و غەیری ئەویش دەڵین: بۆ تیگەیشتن لەمە، پێویست بە موخالەفەکردنی حوکمی دوای خۆی بۆ حوکمی پێشەوەی خۆی دەکات، بەمانای ئەو کۆچکردنەیێ کەوا بریتی‌بوو لە جێهیشتنی وڵات و نیشتیمان، کەوا لە موسولمانان داواکرابوو بۆ مەدینە بیکەن، لە دوای فەتح کردنی مەکە دوایی، بەڵام بە هۆی جیهادکردن و نیەتی چاکەوە بە بەردەوامی دەمینی، وەکو راکردن لە وڵاتی کوفر و دەرچوون بۆ زانست و زانست خوازی و هەڵاتن بەدینەوە لە ترسی فیتنە.

# کۆچ کردن چۆن بەم شێوەیەک دەبێ

بەرلەوەی بچینە ناو باسی جۆرەکانی کۆچکردن و دروستنی و نادروستی کۆچکردنەوە، پێمان خۆشە پرسیارێ بکەین، ئایا کۆچکردن بۆ ولاتانی رۆژئاوا بۆ هەموو کەسێ دروستە؟ بەدەربرینیکی وردتر، ئایا بۆ هەموو تاکیکی موسولمان دروستە بیر لە کۆچکردن بکاتەوە و چۆنی بۆێ بە ئارەزووی خۆی نەخشەی بۆ دابریژێ و لە دوایدا بریاری کۆچکردن بدات بۆ رۆژئاوا؟ یاخود کۆچکردن بە فەرمانی موسولمانان دەبێ؟ هەروەها هەلبژاردنی کەسێ شیاو بۆ شوینی شیاو دەبێ. لەبەر ئەوەی ئەم نەخۆشی کۆچکردنەی ئەمرۆ توشی موسولمانان هاتووە، نەخۆشیەکی زۆر ترسناکەو سەرنجامیکی خراپی لێ دەکەوێتەوە: کە لە کۆتایی ئەم باسەماندا لە بابەتی رەواندنەوەی گومانیك (شبه)دا باسی لیوە دەکەین بە یارمەتی خوای بالادەست.

بەلام هەرچی کۆچکردنی هاوەلە بەریزەکانی پیغەمبەر (ﷺ)، وو ئەوا بە فەرمانی پیغەمبەر (ﷺ) خۆی بوو، ئیستاش دەبێ بە فەرمانی ئیمامی موسولمانان، یاخود جیگری ئیمام بێ.

## جۆرەکانی کۆچکردن و دروستی و نادروستیان

**أ) جۆرەکانی کۆچ کردن:**

١. لە وڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام.

٢. لە وڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی کوفر.

٣. لە وڵاتی ئیسلام بۆ وڵاتی کوفر و تیکەڵاو (مرکبة).

٤. لە وڵاتی تیکەڵاوەوە بۆ وڵاتی ئیسلام.

٥. لە وڵاتی تیکەڵاوەوە بۆ وڵاتی کوفر.

**ب) دروستی و نادروستییان:**

١. لە وڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام:

ئەم جۆرەیان لە نێوان دروستی و واجب بوون دایە. (ئیبنو حەجەری عەسقەلانی) دەڵی: (حیکمەت لە واجب بوونی کۆچکردن بۆ مەدینە لەسەر هەریەکێ کە موسولمان بوو، بۆ ئەوەی لە ئازار و ئەشکەنجەی کافران رزگاریان بێ، چونکە کافارن هەریەکێ لەوان موسولمان بوایە ئازاریان دەدا، تاکو لە دینەکەی پەشیمانی کەنەوە، ئەم ئایەتەش دەربارەی ئەوان دابەزی ﴿إن الذين توفاهم الملائكة ظالمي أنفسهم..... تاکو دەگاتە....

واسعة فتهاجروا فيهـا﴾، ئەم شیوه کۆچکردنەش بەبەردەوامی دەمینێ بۆ هەریەکێ کە موسولمان بێ و لە ولاتی کوفردا بێ و توانای کۆچکردنی هەبێ، بەلام ئەگەر ترسی لەوە نەبوو، کەوا تووشی (فیتنە) دەبێ و توانای ئاشکراکردنی دینەکەی هەبوو، ئەوا مانەوەی لە ولاتی کوفری بۆ دروست دەبێ، بە ئومیدی ئەوەی بانگکردنی کەسانی تر بۆ ناو ئیسلام بە رای (ماوەردی).

٢. لە ولاتی کوفرەوە بۆ ولاتی کوفر:

ئەم جۆرەیان درووستە، وەکو چۆن هاوەلانی پیغەمبەر (ﷺ) کۆچیان کرد بۆ ولاتی حەبەشە، بەمەرجیك لەم ولاتەدا توشی (فیتنە) نەبن. هەر بۆیەشە پیغەمبەر (ﷺ) زیدە لە هەموو ئەو ولاتانە، ئەوی هەلبژارد بۆ کۆچکردن، لەبەر ئەوەی دەیزانی پادشاکەی ئەوێ کە (نەجاشی) بوو، مرۆڤیکی ئاین پەروەر بوو و زوڵم و ستەمی لەلا نەدەکرا و لە فیتنەیان دلنیابوو، بۆیە بە هاوەلانی فەرموو (کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، چونکە پادشایەکی لێیە ستەمی لەلا ناکرێ).

٣. لە ولاتی ئیسلامەوە بۆ ولاتی کوفر و تیکەلاو:

ئەم جۆرە کۆچکردنە بۆ هیچ یەکێ دروست نی‌یە، مەگەر بە فەرمانی ئیمامی موسـولمانان بێ، یاخود بۆ کەسـێ زانسـت خـواز بێ* بـۆ فـیربوون بچیتـە دەرەوە، بەمـەرجێك جـۆری ئـەم زانسـتە لـە قوتابخانـەکانی وڵاتـی خۆیـدا چنگـی نەکـەوێ، یـاخود بـۆ چارەسەرکردنی نەخۆی، یاخود بۆ پێویستی تـر....، ئەمانـەش بەم مەرجە دەبی، کەوا موسولمان بتوانی پاریزگاری دینی خۆی بکـات و خـاوەنی زانسـت و تەقوایـەکی ئـەوتۆبێ کـە بتوانـێ بەرنگاری ژیانەکەی ئەوی ببیتەوە، ئەگەر نا حەرام دەبێ.

---

(*) زانسـت خـوازدەبی ئەوە بزانێ کـە لـەویدا مقامـەرە بـە دینەکـەی دەکـات، چونکـە بـە پـیی قسـەی ئـەو کەسـانەی کـە لـەوێ دەگەرینـەوە، فەسادیکی یەکجار زۆری تیدا بەدی دەکرێ کە لە ژمار نایێ. مرۆڤ تیایدا لە هیچ سـاتیکی ژیانی‌دا لە خۆی ئـەمین نـابی لـە لادان و کردنـی کـاری حەرامی وەکو (زینا)، یان ئەوەتە توشی نەزەری حەرام دەبی کە زینای چاوە و پیشەکیەکیشە بۆ زیناکردن، ئەوش ناتوانی خۆتـی لیْبپـاریزی، چونکـە کاتی گەرانت بـە نـاو شـەقامەکاندا، وەکو ئەوە وایە کە لـە نـاو حـەمام دا بگەرێی و یەکێ لە فیتنەکانی ئەو ئومەتە لەویدا دەبینی، کەوا پیغەمبەر (ﷺ) ئیمەی لی‌ی ئاگادار کردۆتەوە، ئەویش ئافرەتی رووت و قووتە، وەکو ئەو رۆژەی کە لە دایك بووە، زۆر شتی تریش تیادایە کەوا لیرەدا بواری باسکردنی نی‌یە.

٤. لە وڵاتی تێکەڵاوەوە بۆ وڵاتی ئیسلام:

ئەم جۆرەشیان لە نێوان دروست بوون و واجب بوون دایە، کاتی دروست دەبێ، ئەگەر بێتو موسوڵمان ئەو هۆیانەی لە لابێ کەوا دروستی دەکات، کاتێکیش واجب دەبێ، ئەگەر بێتو زەویەکی ئیسلام رووبەرووی هێرشی کافران و دوژمنان بویەوە، بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرمووێ ﴿ لا تقطع الهجرة ما قوتل العدو/ رواه النسائي وأبن ماجه﴾. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر چەسپاندنی حوکمی کۆچکردن و جەنگ و کوشتارکردنی خوا و دینی خوا بەبەردەوامی تاکو رۆژی دوایی.

٥. لە وڵاتی تێکەڵاوەوە بۆ وڵاتی کوفر:

ئەم جۆرەیان دروست نییە و حەرامە، مەگەر زۆر زۆر پێویست بێ، وەکو چوونە دەرەوە بۆ زانستێکی پێویست، یاخود بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکی گرنگ،یان بۆ شتی‌تری لەم بابەتە، کەوا زۆر پێویست بن، بەڵگەش لە سەر حەرام بوونی ئەم حاڵانەی خوارەوەیە:-

أ) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ ﴿ الإسلام يعلو ولا يعلى/ أخرجه الدار القطني ﴾، واتە: ئیسلام زاڵ دەبێ و هیچ شتێك بەسەریدا زاڵ نابێت. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر بەرزی ئەهلی ئیسلامیش بەسەر ئەهلی دینەكانی ترەوە لە هەموو كاروباریكدا لەبەر (مطلق)ی ئەم فەرموودەیە، كەوابوو حەق بۆ ئەهلی ئیمان دەبێ، جا چۆن ئەم حەقە بۆ ئەهلی ئیمان دەبێ لەكاتێكدا موسولمان واز لە وڵاتی خۆی بێنێ و بیەوێ لەناو كافراندا ژیان بباتەسەر و مل كەچی یاسا و دەستوور و رژێمی كۆمەڵایەتی و خورەوشتی ئەوان بێ؟.

ب) ئەگەر بێو ئەم كۆچكردنە بۆ خۆشی بێو ڕاكردن لەو چەرمەسەری و ناخۆشیانە بێ كەوا ڕووبەڕووی موسولمانان دەبێتەوە، ئەوە حەرام دەبێ، لەبەر ئەوەی موالاتكردن و موعاداتكردن بۆ خوا كز و لاواز دەكات، هەروەك (أبو عمر) لە كتێبی (التمهيد)دا باسی ئەوەی كردووە، (كەوا خوای گەورە وەسیەتی بەیەكی لە پێغەمبەرانی كرد، كە بلێتە فلانە زاهید هەرچی زوهد كردنتە لە دونیادا. ئەوا بە هۆیەوە پەلەت كردووە بۆ وەدەست هێنانی خۆشی بۆ خۆت، بەڵیبرانیشت بۆ من بەهانەت بە دەست هێناوە، بەڵام چیت لەو ئەركەی من كردووە كەوا لەسەر شانتە؟ گوتی: ئەی پەروەردگار ئەم ئەركەی تۆ چییە لەسەر من؟

فەرمووی: ئایا جاریٚ لە جاران موالاتی دۆستێکی منت کردووە بۆ من، یاخود لە پێناوی من دژایەتی دوژمنێکی منت کردووە؟). جا لێرەدا پرسیارێك خۆی فەرز دەکات، ئەویش ئەوەیە، ئایا مرۆڤی موسولمان دەتوانێ دژایەتی و دۆستایەتی لە پێناو خوای گەورە ئەنجام بدات، لە کاتێکدا دانیشتووی وڵاتی کافارن بێ؟ یاخود توندترین و بەهێزترین پەتی ئیمان فەرامۆش دەکات؟ ﴿ أوثـق عرىٰ الإيمان الموالاة في الله والمعاداة في الله، والحب فـي الله والبغض في اللــه﴾ حسنه الألبـاني فـي صحيـح الجـامع الصغير. واتە: توندترین و تۆکمەترین پەتی ئیمان: موالاتکردن و موعاداتکردنە بۆ خوا، هەروەها خۆش ویستن و رق لێبونەوەیە لە پێناوی خوا.

ج/ئەگەر موسولمان ویستی کۆچ بکات، ئەبێ بۆ وڵاتێ کۆچ بکات، کەوا خەلکەکەی چاکتر و پاکترین لـە خـەلکی وڵاتەکـەی خۆی، ئەوەکو بەپێچەوانەوە، وەکو حالی ئـەمرۆی موسـولمانان، کەوا بوو کۆچکردن پێویستە لە زەویەکی پیسەوە بۆ زەویەك بێ کە خەلکەکەی چاك بێ، وەکو لە فەرموودەیەکی صەحیح هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ لـە سـەردەمی پێـش ئێـوە پیاوێك هەبوو، نـەوەد و نـۆ کەسـی کوشـتبوو، لـەدوایدا ... گەڕاوەتەوە، دوایی زانایەك فەتوای بۆ دەدا، کە خوای

گەورە تەوبەی لێ قەبووڵ دەکات، بەمەرجێ ئەم زەویە جێ بهێڵێ، کەوا خەلکەکەی ستەمکارن و بچێتە زەویەکی تر، کەوا خەلکەکەی چاکەکاربن، تەواوی ئەم چیرۆکەش لە صحیحی موسلیم و غەیری ئەویشدا هەیە، شتێکی بەلگەنەویستە ئەم وڵاتەی ئێمە تیایدا دەژین چاکترە لە رۆژئاوا و خەلکەکەشی چاکتر و نزیک ترە لە ئیسلام.

## ڕەوانەوەی گومانێک

هەندێ لەو برایانە دەلێن، سەختی باری ئابووری و ناجێگیری باری سیاسی و نەبوونی ئاسایش ناچاری چوونە دەرەوەی وڵاتمان دەکات بەتایبەتی بۆ وڵاتانی رۆژئاوا، بۆ ئەوەی خۆمان تەکوین بکەین و هەندێ مال کۆبکەینەوە و ئەو کاتە دەتوانین خزمەتی ئیسلام و موسولمانانی پێبکەین، هەروەها دەڵێن لەوێدا ئازادی ئاینی هەیە و مرۆڤ دەتوانی پاریزگاری دینەکەی خۆی بکات، ئەم جۆرە گومانە، گومانێکی بێ هێز و لاواز و پووچە، چونکە کەمی رزق و رۆزی هۆیەکی شەرعی نییە بۆ کۆچکردن، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووی: ﴿ فمن كانت هجرته لدنيا يصيبها أو امرأة ينكحها فهجرته الى ما هجر اليه﴾، جا ئەم تەرزە کۆچکردنە، راکردنە لە قەدەری خوای

بالأدەست، لەبەر ئەوەی رزق و رۆزی بە دەست خوای پەروەردگارە کێ بیەوێ دەیداتێ و کێشی بیەوێ نایداتێ، جا لە هەر شوێنێك بێ جیاوازی نییە، چ لەگەرمێ یاخود لە رۆژئاوا، هەروەها هەڵاتن بە هۆی باری سیاسی و ئەمنی دیسان هۆیەکی شەرعی نییە، بەڵکو حەرامیشە، لەبەر ئەوەی دونیا خانووی تاقیکرنەوەیە، تاقیکردنەوەی ئیمانداران بە کافران و هەڵگەڕاوان و مونافیقان و فاسقان و فاجرانە، بەڵکو ئیمانداری ڕاستەقینە بەهۆی ئەم تاقیکردنەوەیە بەدیاردەکەوێت، بۆیەش خوای بە دەسەڵات و کار بەجێ بەم جۆرە شتانە تاقیمان دەکاتەوە ﴿ ولنبلونكم بشيء من الخوف والجوع ونقص من الأموال و الأنفس والثمرات وبشر الصابرين﴾.

خوای کار بەجێ پێی ڕاگەیاندوینە، کەوا بەندەکانی خۆی تاقیدەکاتەوە و توشی تەنگ و چەڵمە و ناخۆشیان دەکات، وەکو دەفەرموی: ﴿ ولنبلونكم حتى نعلم المجاهدين منكم و الصابرين و نبلوا أخباركم﴾. هەروەها دەفەرموی: ﴿الم، أحسب الناس أن يتركوا أن يقولوا أمنا وهم لا يفتنون ولقد فتنا الذين من قبلهم فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين﴾، واتە: ئایا خەڵکی وا دەزانن ئەگە بەزار گوتیان ئیمانمان هێناوە و ئیمانداریین، وازیان لێدەهێنری و توشی تاقیکردنەوە نابن، بەڵکو ئێمە خەڵکانی پێش ئەوانمان

تاقیکردۆتەوە، تاکو ببێتە بەلگەیەك لەسەریان و تا دەرکەوێت، کێنە ئەوانەی راست گۆنە و کێنە ئەوانەی درۆزنن. هەروەها دەفەرمووی: ﴿أم حسبتم أن تدخلوا الجنة ولما يأتكم مثل الذين خلوا من قبلكم مستهم البأساء والضراء و زلزلوا حتى يقول الرسول والذين آمنوا معه متى نصر الله، ألا إن نصر الله قريب/ البقرة﴾، کەواتە پێویستە لەسەر مرۆڤی موسولمان ئارامگربێ لە بەرامبەر ئەو جۆرە تاقیکردنەوانەدا و ئەو بەلاو موسیبەت و تەنگەژمیەی کە توشی دەبێ، سوپاس بۆ خودای بالادەست، کەوا بار و دۆخی ئێمەی هێشتا نەگیشتۆتە رادەیەکی وا سەخت و دژوار، کە موسولمان نەتوانی دروشمە دینی‌یەکانی خۆی وەکو نوێژ و رۆژوو.....هتد ئەنجام بدات، هەروەها ئازار و ئەشکەنجە دانیشمان نەگیشتۆتە سنوریکی وا تاکو وامان لێبکات پەنا ببەینە بەر هەلاتن و چۆل کردنی گورەپان.

ΩΩΩ

## ئەو شوێنەوارە سلبیە پر مەترسیانەی کەوا لە ئەنجامی کۆچکردن بۆ وڵاتانی رۆژئاوا دروست دەبن

شتێکی بەلگەنەویستە کە نیشتەجی‌بوون ومانەوە لە ولاتانی رۆژئاوا چەندەها سەرپیچی‌کردن و شوینەواری سلبی لی‌دەکەوێتەوە بەسەر خۆیان و مندالەکانیان. ئەمەشیان هەندێکە

لەو سابیات و سەرپیچیکردنانەی کەوا توشی دین و ئاکار و رەوشت و هەلس و کەوتی مرۆڤی موسولمان دەبێ:-

یەکەم: نیشتەجێبونیان لە ژێر کۆنترۆلی کافران و ژیانیان لە کۆمەلگایەك، کەوا حوکم و داب و نەریت و خوورەوشتیان موسولمانانە نییە، ئەمەشیان مەترسیەکی گەورەی لەسەر دین و خوورەوشت و ئاکار و رەفتاری مرۆڤی موسولمان دەبی، ئەوانەی لەوێدا هاتوونەتەوە، ئەو هەموو لادانانەیان بە چاوی خۆیان دیوە، وەکو پۆشینی جل و بەرگی ئەوان و لە دەست دانی کەسییتی خۆیان و رابواردن و کات بەسەربردن لە شتیبی هودە و پروپووچ......هتد.

دووهەم: ترسناکترین ئەو شتانەی لەویدا رووبەرووی موسولمانان دەبێتەوە مندالەکانیانە، چونکە ئەوانە یان بەرەو بە جوولەکەبوون دەچن، یاخود بەرەو بە مەسیحی بوون دەچن، ئەمەشیان لەو رێگایانەوە دەبێ:

أ) پەروەردە و فیرکردنیان لە قوتابخانەکاندا لەسەر دەستی جوولەکە و دیانەکان دەبی، ئەمەشیان پێنج رۆژ لە هەفتەیەکدا و بەتێکرایی هەشت کاتژمیر لە هەموو رۆژێکدا.

ب) تیکەلاو بوونی کور و کچ لە خوێندنگاکاندا.

ج) پیشاندانی فلیمی زایەند (جنسی) و ئارەزوو ورژین لە قوتابخانەکانیاندا و هاندانیان بۆی.

د) تیکەڵاو بوونی کور و کچان لە هەلەوانگەکانیان و بەیەکەوە مەلەکردن لەگەڵ هاوڕێ قوتابیەکانیان لە جوولەکە و دیانەکان.

سێیەم: بە هۆی کۆچ کردنی ئەوانەوە، دەرگای کۆچکردن بۆ کەسانیتر دەخرێتە سەر پشت و دەبنە ڕێ خۆشکەر بۆیان، ئەو کاتە بەشێکی زۆری موسولمانان وڵات جێدەهێڵن، ئەمەشیان مەترسیەکی زۆر گەورەی دەبێ لەسەر ئیسلام و موسولمانان، لەبەر ئەوەی گۆرەپان چۆڵ دەبی بۆ دوژمنانی خوا و خالی دەبێ لە موسولمانان، ئەو کاتە کێ هەستی بە جێبەجێکردنی پێویستی دەعوەکردن بۆ خوا و ئارامگرتن لەسەر ئازار و ئەشکەنجە لە پێناوی خوای بەخشندە؟! ﴿ يا بني أقم الصلاة وأمر بالمعروف وانه عن المنكر واصبر على ما أصابك إن ذلك من عزم الأمور﴾. ئەی کێ هەلسی بە پێویستی پارێزکاری کردن لە ئیسلام؟! ﴿ إن تنصروا الله ينصركم و يثبت أقدامكم﴾، ئەی کێ هەلسی بە ئاشکراکردنی پرووپوچی کافران و بیدعە و بیدعەکاران و ئەفسانە و پرووپوچی پێشینان و هەلوەشاندنەوەیان لە بناغەوە و بیناکردنەوەی ئیسلامیکی

راستەقینە لە جیگـای کوفـر و گومـرای؟! ئـەی کـی هەلمـی بـە گیڕانەوەی خەلکی لە بەندایەتی کردنی بەندە بۆ بەندایەتی کردنی خوای کردگار و زانـا؟! ﴿ فـأصدع بمـا تؤمـر وأعـرض عـن المشركين﴾، پیغەمبەر (ﷺ)یش دەفەرمووی: ﴿ لأن يهدي اللـه بك رجلا واحــدا خير لك من حمر النعم﴾، واتە: ئەگەر خوای گەورە بە هۆی تۆوە هیدایەتی یەکێ بدات، ئەوە بۆ تۆ لە هەموو ووشترە سوورەکان باشترە.

چوارەم: لە یادکردنی بنچینەیەك لە بنچینە مەزنەکانی ئیسلام، ئەویش دۆستایەتی‌کردن و دوژمنایەتی‌کردنە لـە پی‌ناوی خـوای گەورە، ئەمەش بە هۆی تیکەلاو بونێکی تەولوەی ئەهلی کوفر و هەست کردنی بەوەی کە وەکو هاوولاتیەکی ئەویێ وایە و پەیوەند و پەیوەست دەبێ بە داخوازیەکانی وەتەنیەت لە خۆش ویستن و دۆستایەتی‌کردن و زیادکردنی ژمارەی کافران، هـەروەها خـاو و خیزانیشی لە ناو کافراندا پەروەردە دەبی و ئەو کاتە رەوشت و داب و نـەریتی ئـەوان هــەلدەگرن و دوور نی‌یــە لــە عــەقیدە و عیبادەت‌کردنیشــیاندا لاســایان بکەنــەوە، بۆیــە پیغەمبــەری خۆشەویستمان فەرموویەتی: ﴿ أنا بـرىء مـن كـل مسلم يقيـم بين أظهر المشركين، قالوا يا رسول الله ولم؟ قال لا تـتردى

ناراهما﴾ رواه أبو داود و الترمذي. مانای ئەوەیە، کەوا شەڕ و خراپەکاریەکی گەلی زۆر لە هاوەلیەتیکردنی نێوان موسولمانان و کافران دا هەیە، ئەوە تەنها بە هاوەلیەتی کردنی ان، ئەدی دەربارەی ئەوە چیدەلێی، کەوا لە وڵاتیاندا نیشتەجی بن و وەکو ئەوان بژین؟! پیغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئەمە لە فەرموودەیەکی صەحیح دا دەفەرمووی: ﴿مثل الجليس الصالح كمثل بائع مسك إما أن يحذيك* و إما أن تشتري منه و إما أن تشم منه رائحة طيبة، ومثل الجليس السوء كمثل الحداد إما أن يحرق ثيابك و إما أن تشم منه رائحة كريهة﴾، واتە: نموونەی هاودەمی چاك وەکو مسك فرۆشتن وایە، یان ئەوەتە بۆنت لیدەدا، یان ئەوەتە لیی دەکری، یاخود بۆنیکی خۆشی لیدەکەی، نموونەی هاودەمی خراپیش وەکو کورەچی وایە، یان جل و بەرگت دەسوتێنێ یاخود بۆنیکی ناخۆشی لیدەکەی. کەواتە هەر دەبیتە شۆی زەرەر و زیان، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش تیکەلاویان بکرێ، پیغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووی: ﴿من جامع المشرك فهو مثله﴾، واتە: هەر کەسی تیکەلاوی موشریك بکات، ئەوا وەکو وی دەژمیردری.

---

يحذيك : يعطيك

له كۆتاییدا موسولمانان لەوە ئاگادار دەكەینەوە، كەوا رووكردنە ولآتانی رۆژئاوا، مەترسیەكی یەكجار گەورەو شوینەواریكی خراپی دەبیّ لە سەر خۆیان و خیّزان و مندالآنیان لە لایەنی دین و ئاكار و رەوشتیان.

**اللهمَّ أرنا الحق حقاً وأرزقنا إتباعه، وأرنا الباطل باطلا و أرزقنا إجتنابه و لا تجعله متلبسا علينا فنضل. وأخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين، وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله و صحبه و سلم.**

(عن أميرِ المُؤمنينَ أبي حفص عُمرَ بنِ الخطاب رضي الله عنه :

قال سمعتُ رسولَ الله ﷺ يقولُ : « إنَّمَا الأعمالُ بالنِّيَّات وإنَّما لِكُلِّ امرئٍ ما نوَى . فمَنْ كانَتْ هِجرَتُهُ إلى اللهِ ورَسُولِهِ فهِجرَتُهُ إلى اللهِ ورَسُولِهِ ، ومَنْ كانَتْ هِجرَتُهُ لِدُنيَا يُصِيبُهَا أوامرَأةٍ يَنكِحُهَا فهِجرَتُهُ إلى ما هَاجرَ إليه »